چاپی دووەم

زنجیرەی زانستەکانی کۆمپیوتەر
٦

مایکرۆسۆفت

# وۆرد ٢٠٠٠






ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٦

# بەرنامەی
# وۆرد ٢٠٠٠

نوزاد

ئامادەکردنی : ئاراس حاجی مەولود

چاپی دووەم

التفسير

١٤٢٦ هەولێر ٢٠٠٥

نـــــاوی کتێـــــــب: بەرنامەی ووَرد ٢٠٠٠
ئامـــــــــادەکردنی: ئاراس حاجی مەولود
کۆمپیوتــــــــــــەر: مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس/ هەولێر
تـــــایتلی بـــــەرگ: نەوزاد کۆیی
چاپ و بڵاوکردنــەوەی: نووسینگەی تەفسیر/ هەولێر
ژمـارەو ســاڵی چــاپ: چاپی دوەم ٢٠٠٥
تـــــــــــیراژ: ٢٥٠٠ دانە
ژمــارەی ســـپاردن: ٥١٣ ساڵی ٢٠٠٢
چــــــــاپکردن: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
تەلەفۆن : ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
مۆبایل : ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢٩١
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ❀ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ❀ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ❀ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ❀ اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ ❀ صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ الْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ ❀﴾

خوێنەری خۆشەویست.. حەز دەکەم لەم بارەیەوە هەندێ ڕۆشنایی بخەمە سەر ئەو باسەی کە لە ناو بەشەکانی ئەم بابەتە، کە ئامادەم کردووە.. جا لێرەوە دەڵێم ئەم بەرهەمە (وۆرد ٢٠٠٠) بەرهەمێکی سەرەکییە لە بەرنامەکانی کۆمپیوتەر، دەتوانم بڵێم لە ناو بەرنامەکانی کۆمپیوتەر، بەرنامەی وۆرد، لە دوای سیستەمی ویندۆز، بە پلە دوو دەژمێردرێت، بۆیە دەبێت گرنگیەکی زۆری پێ بدەین، چونکە ئەم بەرنامەیە تایبەتە بە نووسین و چاپ کردن و کۆمەڵێ شتی تر، کە هەموویان بۆ ئەو کەسانە گرنگن کە دەیانەوێ فێری بەکارهێنانی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بن، هەرچەندە پێش ئەم بەرهەمە، بەرهەمێکی ترم بە ناوی (بەرنامەی وۆرد ٩٧) بڵاوکرایەوە، بەڵام لێرەدا پێم خۆشە بڵێم کە، لە ڕووی کارکردن و لە ڕووی دارشتنی نووسینەکان و وێنەی شەرحەکان، هەندێ جیاوازی کەم لە نێوان (بەرنامەی وۆرد ٩٧) و (بەرنامەی وۆرد ٢٠٠٠)دا هەیە، کە لە ناوەڕۆکی ئەم بەرهەمەدا تیشکم خستۆتە سەر.. بەئومێدم جێگای سوود و ڕەزامەندی ئێوەی خۆشەویست بێت..

**ئاراس حاجی مەولود**

**مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس**

هەولێر باڵەخانەی حاجی یەحیا، نهۆمی دووەم

سەرەوەی نوسینگەی تەلەفۆنی دیلان

ت: ٢٢٣٢٧٢١

# بەشی یەکەم ( ١ )

١- سەرەتایی چوونە ناو بەرنامەی وۆرد

٢- چۆنییەتی هێنانی لاپەڕەیەك بۆ ناو بەرنامەکە

٣- چۆنییەتی ئامادە کردنی لاپەڕەکە

٤- چاو پێداخشانەوەیەك پێش چاپ کردن

٥- چۆنییەتی چاپ کردنی لا پەڕە

٦- چۆنییەتی پاراستنی لاپەڕە

٧- چۆنییەتی کردنەوەی لاپەڕەیەکی پارێزراو

٨- چۆنییەتی داخستنی بەرنامەکە ، لاپەڕەکە

## ١- سەرەتای چوونە ناو بەرنامەی وۆرد

### دەتوانین بە دوو ڕێگا بچینە ناو بەرنامەی وۆرد:

**ڕێگای یەکەم:-**

سەرەتا دەچینە سەر MyComputer و ئنجا دەچینە سەر بەشە هاردی /:C، لەوێوە دەچینە سەر Program file، ئنجا دەچینە سەر Microsoft Office ئنجا Microsoft Word، پاشان بە دەبڵ کلیکی لای چەپ بەرنامەی وۆرد دەکەینەوە .



**ڕێگای دووەم :-**

هەروەها بۆ کردنەوەی بەرنامەی وۆرد، دەتوانین لە ڕێگای لیستی (Start)ـەوە بچینە سەر هەڵبژاردەی Program، لەوێشەوە بچینە سەر Microsoft Word و بە یەک جار کلیکی لای چەپ بیکەینەوە .



## ٢- چۆنییەتی هێنانی لاپەڕەیەك بۆ ناو بەرنامەكە

بۆ هێنانی لاپەڕەیەكی تازە بۆ ناو بەرنامەی وۆرد، سێ ڕێگامان هەیە.

**ڕێگای یەكەم:-**

لە ناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێ دەچینە سەر فەرمانی (جدید) و یەک جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین، شێوەیەكمان بۆ دەردەچێ، لەو شێوەیەدا فەرمانی (مستند فارغ ) هەڵدەبژێرین و كلیكی لە سەر دەكەین .



**ڕێگای دووەم:-**

هەر لە ناو بەرنامەی وۆرد و لە سەر شریتی (قیاسی)، کە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی لاپەڕەکە و ژێرەوەی شریتی لیستەکان، دەچینە سەر ئەم شێوەیە ( 📄 ) کە شێوەی پەڕەیەکی سپیە، یەک جار کلیکی لە سەر دەکەین، دەبینین یەکسەر بێ دەرکەوتنی هیچ شێوەیەک، لاپەڕەیەکمان بۆ دێنێتە ناو بەرنامەکەوە.



**ڕێگای سێهەم:-**

هەروەها دەتوانین بە کیبۆرد لاپەرەیەکی تازە بۆ ناو بەرنامەی وۆرد بێنین، کە ئەویش بە هۆی داگرتنی هەردوو کلیلی (Ctrl + N) بەیەکەوە، بێ دەرکەوتنی هیچ شێوەیەک، لاپەرەیەکمان بۆ دەردەکەوێ.



# ٣- چۆنییەتی ئامادە کردنی لاپەڕەکە

**چۆنییەتی ئامادە کردنی لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد بە دوو ڕێگا دەبێت:**

**ڕێگای یەکەم:-**

ئەگەر ویستمان لە هەر چوار لای لاپەرەکە بۆشایی بەجێ بهێڵین، ئەوە دەچینە سەر لیستی (ملف) و، لەوێ دەچینە سەر (أعداد الصفحة) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا دەچینە سەر (هوامش)، بە هۆی ئەو چوار بۆشایەی کە لەوێ هەیە، دەتوانین قەبارەی بۆشایی بۆ دەور و بەری لاپەرەکە دیاری بکەین.



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین لە هەمان ئەو شێوەیەی لە ڕێگای یەکەمدا دەرکەوت، بچینە سەر بەشی (حجم الورق) کە دەکەوێتە تەنیشت (هوامش)، لەوێدا دەتوانین بە هۆی ئەو دوو بۆشایەی کە لەوێدا هەیە قەبارەی لاپەرەکە، بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبستمانە، دیاری بکەین.



## ٤- چاو پێداخشانەوەیەك پێش چاپ كردن

**لە پێش چاپكردنی لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد، وا بە باش دەزانین هەموو كات پێش ئەوەی لاپەڕەكە چاپ بكەین، چاوێكی پێدا بخشێنینەوە، بۆ چاوپێداخشانەوە لەپێش چاپ كردن دوو ڕێگامان هەیە.**

**ڕێگای یەكەم:-**

سەرەتا لەناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێشەوە دەچینە سەر (معاينة قبل الطباعة) و یەک جار كلیكی لای چەپی لە سەر دەكەین، دەبینین كە شێوەی لاپەرەكەمان بە گشتی بۆ دەردەكەوێ.. لە كاتی(معاينة)دا لاپەرەكە لە ناو شێوەكە چۆن ببینی، ئەوە هەر بەو شێوەیە لاپەرەكەت لە سەر وەرەقە بۆ چاپ دەكات، واتا چاو پێداخشانەوەكە نمونەیەكت پێ نیشان دەدات، كە ئەو نمونەیە شێوەی ئەو وەرەقەیەیە، كە تۆ بە نیازی چاپی بكەیت.. بۆ چوونە دەرەوەش لە(معاينة قبل الطباعة)، لەسەر شریتی **(معاينة)** دەچینە سەر (أغلاق).



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری (معاینة قبل الطباعة ) لە سەر شریتی ( قیاسي ) ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی ئەم شێوەیەی، کە لە وێنەکەدا ئاماژەی بۆ کراوە، بۆ ئەنجام دانی چاوپێداخشانەوەکە، یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین.



# ٥- چۆنییەتی چاپ کردنی لاپەڕە

**بۆ چاپ کردنی لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد، دوو ڕێگامان هەیە:**

**ڕێگای یەکەم:-**

سەرەتا دەچینە سەر شریتی (قیاسي)، لەوێوە دەچینە سەر شێوەی ئامێری چاپ کردن(طابعة)، کە ئەمە شێوەکەیەتی ( )، یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین، بێ دەرکەوتنی هیچ شێوەیەک، لاپەڕەکەمان بۆ چاپ دەکات.



**ڕێگای دووەم:-**

سەرەتا لە ناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (طباعة) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت؛ لەو شێوەیەدا دەچینە سەر زانیاریەکانی چاپ کردن، کە بە ئارەزووی خۆمان زانیاری پێ دەدەین، بۆ چاپ کردنی نووسینەکانمان، دوای پێدانی زانیاریەکان، بۆ ئەنجام دانی چاپکردنەکە، کلیک لە سەر (موافق) دەکەین.



**ڕێگای سێهەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بە یەکەوە (Ctrl+P) ئەم کارە ئەنجام دەدەین.



# ٦- چۆنییەتی پاراستنی لاپەڕە

**بۆ پاراستنی لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد، سێ ڕێگامان هەیە:**

**ڕێگای یەكەم:-**

ئەگەر ویستمان لاپەرەیەک بپارێزین و (حفظ)ی بکەین، ئەوە لە ناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (حفظ) یان (حفظ باسم)، لەوێ یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی (حفظ في)، ئەو شوێنە هەڵدەبژێرین کە دەمانەوێ فایلەکەی تێدا بپارێزین، پاشان لە بۆشایی (أسم الملف)دا بە ئارەزووی خۆمان ناوێک بۆ فایلەکە دادەنێین و دەینووسین، ئنجا بۆ پاراستنی لاپەرەکە بەو ناوە، کلیک لەسەر (حفظ) دەکەین..



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی (قیاسي)یەوە ئەنجام بدەین، بەوەی کە یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر ئەم شێوەیە ( ) بکەین، هەمان شێوەی پێشوومان بۆ دەردەچێت، بەهەمان هەنگاوەکانی ڕێگای یەکەم فایلەکەمان دەپارێزین.



**ڕێگای سێهەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بەهۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + S) دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین..



## ٧- چۆنییەتی کردنەوەی لاپەڕەیەکی پارێزراو

**بۆ کردنەوەی هەر لاپەڕەیەکی پارێزراو لە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین بە دوو ڕێگا ئەنجامی بدەین :**

**ڕێگای یەکەم:-**

سەرەتا لە ڕێگای شریتی لیستەکانەوە دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێوە دەچینە سەر (فتح) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا؛ لە بۆشایی یەکەم کە بە ناوی (بحث في)یە، ئەو شوێنە هەڵدەبژێرین کە فایلەکەمان تیادا (حفظ) کردووە، دوای دەرکەوتنی شوێنەکە، دەچینە سەر ئەو فایلەی کە مەبەستی کردنەوەمان هەیە و دیاری دەکەین، ئنجا یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر( فتح) دەکەین، دەبینین فایلە دیاریکراوەکەمان بۆ دەکاتەوە .



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی (قیاسي)یەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بەهۆی ئەم شێوەیەوە ( )، کە یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، هەمان شێوەکانی پێشوومان بۆ دەردەچێتەوە و بۆ کردنەوەی لاپەرەیەکی پارێزراو هەمان هەنگاوەکانی پێشوو ئەنجام دەدەین.



**ڕێگای سێیەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، کە ئەویش بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + O) شێوەکەمان بۆ دەکرێتەوە و، دەتوانین هەمان هەنگاوەکانی پێشوو ئەنجام بدەین.



## ٨- چۆنییەتی داخستنی بەرنامەکە یان لاپەڕەکە

بۆ داخستنی هەر لاپەڕەیەك لە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین بە چەند ڕێگایەك ئەو کارە ئەنجام بدەین، هەروەها بۆ داخستنی بەرنامەکەش دەتوانین چەند ڕێگایەك بە کاربێنین .

**ڕێگای یەکەم:-**

لە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین لاپەڕەی کراوە بە هۆی نیشانەی (☒)، کە دەکەوێتە ڕیزی شریتی لیستەکان، دابخەین، کە بە یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر شێوەکە دەبێت . بۆ داخستنی بەرنامەکەش کلیک لەسەر هەمان نیشانە لەڕیزی شریتی ناونیشان دەکەین.



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی لیستەکانەوە ئەنجام بدەین، دەچینە سەر لیستی (ملف)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( اغلاق ) بۆ داخستنی لاپەڕەکە و( انهاء ) بۆ داخستنی بەرنامەکە، کە هەر یەک لەوانە یەک جار کلیکی لای چەپیان لە سەر دەکەین.



**ڕێگای سێیەم:-**

هەروەها بۆ داخستنی لاپەڕەکە، دەتوانین لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەم کارە ئەنجام بدەین، بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + W) دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین.

بۆ داخستنی بەرنامەکەش، دەتوانین لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەم کارە ئەنجام بدەین، کە ئەویش بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (ALT+F4) دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین.



# بەشی دووەم ( ٢ )

١- کلیلە گرنگەکانی سەرکیبۆرد .

٢- ئەو کلیلانەی سەرکیبۆرد کە وشە کوردییەکانی پێ دەنوسرێ .

٣- ناسینی کلیلی فەرمانەکان .

٤- گەڕانەوە و دووبارە دانانەوە .

٥- بڕین و لەبەرگرتنەوە و دانانی نووسینێک .

٦- چۆنییەتی دیاری کردنی نووسینێک .

٧- چۆنییەتی سڕینەوەی نووسینێک .

## ١- كـليله گرنگەكانى سەر كيبۆرد

**بۆ باس كردنى كليله گرنگەكانى سەر كيبۆرد، باسى ئەم چەند كليله دەكەين، كە هەندێ كارى گرنگى پێ ئەنجام دەدرێت:**

١. كليلى Back Space واتا سڕينەوەى نووسينەكان لە كۆتايى دێڕەكەوە .

٢. كليلى Enter واتا چوونە سەر دێڕێكى تازە لە ناو لاپەڕەكە.

٣. كليلى Shift : ئەم كليلە بە زۆر شێوە بەكار دەهێنرێت؛ دەتوانين ئەم كليلە بۆ دانانى ئەو هێمايانەى لەسەرەوەى كليلى ژمارەكان دانراوە بەكار بێنين.. هەروەها دەتوانين ئەم كليلە لە گەڵ كليلى Ctrl بۆ گۆڕينى ئاراستەى نووسينەكان لە عەرەبيەوە بۆ ئينگليزى يان بە پێچەوانەوە بەكار بێنين .

٤. كليلى Ctrl : لە زۆر كاتدا دەتوانين ئەم كليلە لەگەڵ كليلى وشەكان بەكار بێنين بۆ ئەنجام دانى ئەو فەرمانانەى كە لە ناو ليستەكاندا هەن و ئەم هێمايانەيان لە بەرامبەردا نوسراوە، واتا كليلى Ctrl لە گەڵ كليلى وشەكان بە كليلى فەرمانەكان ناسراوە .

٥. كليلى Delete واتا سڕينەوە؛ ئەم كليلە بۆ سڕينەوە بەكاردێ، ئەگەر لە پێشەوەى دێڕ بوين؛ ئەوا دەتوانين بە هۆى ئەم كليلەوە نووسينەكان بسڕينەوە .

٦. كليلى End واتا كۆتايى، بۆ چوونە سەر كۆتاى دێڕ بەكاردێ.

٧. كليلى Home واتا سەرەتا، بۆ چوونە سەر سەرەتاى دێڕ بەكاردێ.

٨. كليلى Page Up واتا سەرەوەى لاپەرە، بۆ چوونە سەرەوەى لاپەرە بەكاردێ.

٩- کلیلی Page Down واتا ژێرەوەی لاپەرە، بۆ چوونە ژێرەوەی لاپەرە بەکاردێ.

١٠- کلیلی Caps Lock ؛ ئەم کلیلە تەنها لەکاتی نووسینی ئینگلیزی بەکاردێ، کە ئەویش ئەگەر کلیلەکە دابگرین، ئەوا نووسینەکانمان بۆ دەکات بە وشەی گەورە(capital).

١١- کلیلی Tab ؛ ئەم کلیلە بۆ هاتوچۆکردن لە ناو خشتەکان بەکار دەهێنرێت، هەروەها دەکرێ بۆ جێ هێشتنی بۆشاییەکی زۆر لە بەینی نووسینەکان بەکاربهێنرێت.

١٢- کلیلی Esc ؛ ئەم کلیلە بۆ پەشیمان بوونەوە لە ئەنجامدانی کارێک بەکار دەهێنرێت.

١٣- کلیلی ئاراستەکان؛ دەتوانرێت بەهۆی ئەم کلیلانەوە هاتوچۆ لەناو نووسینەکاندا بکرێت، هەر یەکە بەو ئاراستەیەی بۆی دیاری کراوە لە ناو نووسینەکان دەڕوات.



## ٢- ئەو کلیلانەی سەر کیبۆرد کە وشە کوردییەکانی پێ دەنووسرێ

بۆ ناسینی ئەو کلیلانەی وشە کوردییەکانی پێ دەنووسرێ، سەرەتا خەت(FONT)ەکە دەگۆڕین بۆ خەتێکی کوردی، پاشان وشە کوردییەکان بە داگرتنی ئەم کلیلانەی خوارەوە دەنووسین:

١- کلیلی  بۆ نووسینی پیتی ( ڤ ) ی کوردی ..

٢- کلیلی  بۆ نووسینی پیتی ( گ ) ی کوردی..

٣- کلیلی  بۆ نووسینی پیتی ( پ ) ی کوردی..

٤- کلیلی  بۆ نووسینی پیتی ( چ ) ی کوردی..

٥- کلیلی  بۆ نووسینی پیتی ( ژ ) ی کوردی ..

٦- کلیلی  +  بۆ دانانی (ˇ) لە سەر پیتەکان..

٧- کلیلی  +  بۆ دانانی (٧) لە ژێر پیتەکان..

## ٣- نـاسينى كـلـيـلـى فـەرمـانـەكان
## ( ئەو فەرمانانەی بە كيبۆرد ئە نجام دەدرێن )

بۆ ناسینی ئەو فەرمانانەی کە بە کیبوردەکە ئەنجام دەدرێن، بڕوانە ئەم لیستە کە چەند فەرمانێکی تێدایە :

١- (Ctrl + Z) بۆ گـەڕانەوە لـە كـارى پێشوو .
٢- (Ctrl + X) بۆ بـڕينـى نـووسين، يـان بـەشێك .
٣- (Ctrl + C) بۆ لەبەر گرتنەوەی نووسين، يان بەشێك .
٤- (Ctrl + V) بۆ دانـانی نـووسين، يان بەشێك .
٥- (Ctrl + N) بۆ هێنـانـی لا پـەڕەيەكى تازە .
٦- (Ctrl + A) بۆ ديـارى كـردنـى نووسينەكە .
٧- (Ctrl + S) بۆ پـاراسـتـن( حفظ )ى لا پـەڕە .
٨- (Ctrl + F) بۆ گـەڕان بـە دواى نـووسين .
٩- (Ctrl + H) بۆ گۆڕينى وشە بە وشەيـەكـى تر .
١٠- (Ctrl + G) بۆ چـوونـە سـەر لا پـەڕە يان دێڕ .
١١- (Ctrl + J) بۆ ڕێكخستنى نووسينەكان لە يەك ئاست .
١٢- (Ctrl + L) بۆ بردنى نووسينەكان بـۆ لاى چـەپ .
١٣- (Ctrl + Q) بۆ بردنى نووسينەكـان بـۆ لاى ڕاست .
١٤- (Ctrl + E) بۆ بردنى نووسينەكان بۆ ناوەڕاستى لا پەڕە .
١٥- (Ctrl + Y) بۆ دووبارە دانانـەوەى نووسينێك .
١٦- (Ctrl + U) بۆ دانانى خەتێك لە ژێر نووسين .
١٧- (Ctrl + I) بۆ لار كردنـەوەى نووسين ( مائل ) .
١٨- (Ctrl + O) بۆ كـردنـەوەى بەشێكى پارێزراو .
١٩- (Ctrl + P) بۆ فـەرمـانـى چـاپ كـردن .

٢٠- ( Ctrl + w ) بۆ داخستنی لاپەڕەکە .

٢١- ( Alt + f 4 ) بۆ داخستنی بەرنامە .

٢٢- ( م + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( ملف ) لە ناو وۆرد .

٢٣- ( ح + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( تحرير ) لە ناو وۆرد .

٢٤- ( ع + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( عرض ) لە ناو وۆرد .

٢٥- ( ر + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( ادراج ) لە ناو وۆرد .

٢٦-( س + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( تنسيق ) لە ناو وۆرد .

٢٧- ( د+ Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( ادوات ) لە ناو وۆرد .

٢٨- ( ج + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( جدول ) لە ناو وۆرد .

٢٩- ( گ + Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( اطار ) لە ناو وۆرد .

٣٠- ( ت+ Alt ) بۆ کردنەوەی لیستی ( تعليمات ) لە ناو وۆرد .

٣١- ( Ctrl + Shift ) لای ڕاست بۆ نووسین بە ئاراستەی ( عربی ) .

٣٢- ( Ctrl + Shift ) لای چەپ بۆ نووسین بە ئاراستەی ( ئینگلیزی ) .

٣٣- ( د + [redacted] Ctrl ) بۆ گەورە کردنی نووسین لە ناو بەرنامەی وۆرد .

٣٤- ( ج + [redacted] Ctrl ) بۆ بچوك کردنی نووسین لە ناو بەرنامەی وۆرد .

## ٤- گەڕانەوە و دووبارە دانانەوە

**دوای ئەنجام دانی هەر کارێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانی بە چەند شێوەیەك گەڕانەوە یان دووبارە دانانەوەی نووسینێك ئەنجام بدەین .**

**ڕێگای یەکەم:-**

## بۆ گەڕانەوە

بۆ گەرانەوە لە نووسینێک، یان لە بەشێک، سەرەتا دەچینە سەر شریتی لیستەکان و لەوێ دەچینە سەر لیستی (تحریر)، لەوێش دەچینە سەر فەرمانی (تراجع ) و بۆ ئەنجام دانی گەرانەوەکە یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین.



## بۆ دووباره دانانەوه

بۆ دووباره دانانەوەی ئەو بەشەی کە لێی گەراینەوە، بە هەمان شێوە دەچینە سەر لیستی (تحریر) و، بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە، لەوێ کلیک لە سەر فەرمانی (أعادة الكتابة) دەكەین.



رێگای دووەم:-

## بۆ گەڕانەوە و دووبارە دانانەوە

هەروەها دەتوانین ئەم دوو کارە لە رێگای شریتی (قیاسي)یەوە ئەنجام بدەین، بە هۆی ئەم دوو شێوەیە: ( )، ئەم شێوەیە ( ) بۆ گەڕانەوە و، ئەم شێوەیەش ( ) بۆ دووبارە دانانەوە بەکار دەهێنرێت.



رێگای سێهەم:-

## بۆ گەڕانەوە و دووبارە دانانەوە

هەروەها دەتوانین ئەم دوو کارە لە رێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، بۆ گەرانەوە بە هۆی داگرتنی هەردوو کلیلی (Ctrl + Z) بەیەکەوە، بۆ دووبارە دانانەوەش هەردوو کلیلی (Ctrl + Y) بەیەکەوە دادەگرین.



## ٥- بڕین و له بەر گرتنەوە و دانانی نووسینێك

بۆ بڕین و لەبەر گرتنەوە و دانانی نووسینێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین بە چەند شێوەیەك ئەم کارە ئەنجام بدەین .

### أ/ بۆ بڕینی نووسینێك

**ڕێگای یەکەم:-**

بۆ بڕینی نووسینێک لە ناو لاپەڕەکە، سەرەتا نووسینەکە دیاری دەکەین، پاشان دەچینە سەر لیستی (تحرير)، لەوێوە دەچینە سەر (قص) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین کاری بڕینەکەمان بۆ ئەنجام دەدات..



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری بڕینەکە بە هۆی شریتی (قیاسي)یەوە ئەنجام بدەین بەهۆی ئەم شێوەیە (✂)، کە دوای دیاری کردنی نووسینەکە یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کاری بڕینەکەمان بۆ ئەنجام دەدات.



**ڕێگای سێهەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری بڕین لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + X) دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین.



## ب/ بۆ لەبەر گرتنەوەی نووسینێك

**ڕێگای یەکەم :-**

بۆ لەبەر گرتنەوەی نووسینێک لەناو لاپەرەیەک، سەرەتا ئەو نووسینە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ لەبەری بگرینەوە، ئنجا دەچینە سەر لیستی (تحریر)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (نسخ) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین کاری لەبەرگرتنەوەکەمان بۆ ئەنجام دەدات.



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری لەبەرگرتنەوەکە بەهۆی شریتی (قیاسي)یەوە ئەنجام بدەین، بەهۆی ئەم شێوەیە ( 📋).. دوای دیاری کردنی نووسینەکە، بۆ ئەنجام دانی کاری لەبەرگرتنەوە، یەک جار کلیکی لای چەپ لەسەر شێوەکە دەکەین.



**ڕێگای سێیەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری لەبەرگرتنەوە لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + C) دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین.



## ج/ بۆ دانانی نووسینێك

**ڕێگای یەکەم:-**

بـۆ دانـانی نووسـینێک کـە بـەهۆی فـەرمانی بڕیـن یـاخود لەبەرگرتنـەوە هەڵگیراوە، لە ناو لاپەڕەکە دەچینە ئەو شوێنەی کە دەمانـەوێ نووسـینەکەی لێ دابنێین، ئنجا دەچینە سەر لیسـتی (تحریـر)، لـەوێوە دەچینـە سـەر فـەرمانی (لصق) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسـەر دەکـەین، دەبینـین کـە نووسـینە هەڵگیراوەکەمان لەو شوێنە بۆ دادەنێت..



**رێگای دووەم :-**

هەروەها دەتوانین کاری دانانەوەی  نووسینەکە بە هۆی شریتی (قیاسي)یەوە ئەنجام بدەین؛ دەچینە سەر شێوەی ( ) و، بۆ دانانی نووسینەکە یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین..



**ڕێگای سێیەم:-**

هەروەها دەتوانین لە ڕێگای کیبۆردەوە، کاری دانانی نووسینێک لە شوێنێک ئەنجام بدەین، دەتوانین بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + V) ئەم کارە ئەنجام بدەین.



# ٦- چۆنییەتی دیاری کـردنی نووسینێك

**بۆ دیاری کردنی هەر نووسینێك لە ناو بەرنامەی وۆرد دەتوانین بە چەند شێوەیەك ئەم کارە ئەنجام بدەین .**

## أ/ بۆ دیاریکردنی بەشەنووسینێك

**ڕێگای یەکەم:-**

دەتوانین ئەم کارە بەهۆی ماوسەکە ئەنجام بدەین، کە دەبێت ماوسەکە بەرینە سەر ئەو شوێنەی دەمانەوێ بەشە نووسینێکەی لێ دیاری بکەین، ئنجا کلیکی لای چەپ دەکەین و ماوسەکە بەو ئاراستەی کە خۆمان دەمانەوێت ڕادەکێشین .



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری دیاری کردنی نووسینێک لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، کە ئەویش بە هۆی داگرتنی کلیلی (Shift) لەگەڵ یەکێک لە کلیلی ئاراستەکان، دەتوانین بە داگرتنی ئەم دوو کلیلە بە یەکەوە ئەو کارە ئەنجام بدەین.



## ب/ بۆ دیاری کردنی نووسینەکان بە گشتی

**ڕێگای یەکەم:-**

بۆ ئەنجام دانی دیاری کردنی گشتیی نووسینەکان، دەتوانین لە ڕێگای شریتی لیستەکانەوە ئەنجامی بدەین، دەچینە سەر لیستی (تحرير)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (تحديد الكل)، بۆ ئەنجام دانی دیاری کردنەکە یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین .



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین کاری دیاری کردنی گشتیی نووسینەکان لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + A) دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین.



## ٧- چۆنییەتی سڕینەوەی نـووسینێك

**بۆ سڕینەوەی هەر بەشێك، یان هەر نووسینێك لە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین چەند ڕێگایەك بە کاربێنین :**

**ڕێگای یەکەم:-**

بۆ سڕینەوەی بەشە نووسینێک لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد٢٠٠٠، ئەگەر ئاراستەی خەتی نووسینەکە لە کۆتایی دێڕدا بوو ئەوە بە هۆی کلیلی Back space کە ئەمە شێوەکەیەتی (⇦)، دەتوانین نووسینەکان پیت بەپیت بسڕینەوە، بەڵام ئەگەر ئاراستەی خەتی نووسینەکە لە سەرەتای دێڕەکەدا بوو، ئەوا بە هۆی کلیلی Delete دەتوانین نووسینەکان پیت بەپیت بسڕینەوە .



**ڕێگای دووەم:-**

لەم ڕێگایەدا، پێش ئەنجام دانی کاری سڕینەوەی بەشێکی نووسینەکە لە ناو بەرنامەی وۆرد، بەشە نووسینەکە دیاری دەکەین، لە بەشی ڕابردودا باسی چۆنییەتی دیاری کردنی نووسینەکانمان کرد، ئنجا دوای دیاری کردنی ئەو بەشە نووسینەی کە دەمانەوێ بیسڕینەوە، بە ڕێگای شریتی لیستەکانەوە دەچینە سەر لیستی (تحرير)، لەوێشەوە بچینە سەر فەرمانی(مسح)، بۆ ئەنجام دانی سڕینەوەکە یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین.



# بەشی سێهەم ( ٣ )

١- چۆنییەتی گەڕان بە دوای نووسینێك یان وشەیەك

٢- چۆنییەتی گۆڕینی نووسینێك یان وشەیەك

٣- چۆنییەتی چوونە سەر لاپەڕە

٤- چۆنییەتی ڕێکخستنی لاپەڕەکان

٥- چۆنییەتی دانان یان لابردنی شریتی بەشەکان

٦- چۆنییەتی دانان یان لابردنی ڕاستە

## ١- چۆنییەتی گەڕان بە دوای نووسینێك یان وشەیەك

**لە ناو نووسینێکی زۆر لە بەرنامەی وۆرد دا، لە جیاتی ئەوەی کە دێڕ بە دێڕ بە شێوەیەکی زەحمەت بە دوای نووسینێك دا بگەڕێین، دەتوانین بە شێوەیەکی ئاسان بە دوایدا بگەڕێن.. دەتوانین ئەم کارە بە چەند ڕێگایەك ئەنجام بدەین .**

**ڕێگای یەکەم:-**

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە لە ناو فایلی نووسینەکان دەچینە سەر لیستی (تحرير)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (بحث) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا لە بۆشاییەکە ئەو وشەیە دەنووسین کە دەمانەوێ بە دوایدا بگەڕێین، ئنجا بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە کلیک لە سەر (بحث عن التالي) دەکەین، دەبینین ئەو وشەیەمان بۆ دەدۆزێتەوە کە ئێمە بە دوایدا دەگەڕاین .



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای کیبۆردەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بەهۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl +F) هەمان شێوەی پێشومان بۆ دەردەکەوێت، ئنجا هەمان هەنگاوەکانی ڕێگای یەکەم دووبارە دەکەینەوە .



## ٢ - چۆنییەتی گۆڕینی نووسینێك یان وشەیەك

**بۆ گۆڕینی نووسینێك یان وشەیەك لە ناو نووسینێکی زۆری ناو بەرنامەی وۆرد، لە جیاتی ئەوەی کە دێڕ بەدێڕ و بە شێوەیەکی زەحمەت بەدوای نووسینەکە یان وشەکەدا بگەڕێین و بیگۆڕین، دەتوانین بە شێوەیەکی ئاسان ئەنجامی بدەین..**

**ڕێگای یەکەم:-**

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە لەناو بەرنامەی وۆرد دەچینە سەر لیستی (تحرير)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (استبدال) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا دوو بۆشایی هەیە، لە ناو بۆشایی یەکەم وشە هەڵەکە دەنووسین، لە بۆشایی دووەم وشە ڕاستەکە دەنووسین، بۆ گۆڕینی وشە هەڵەکە بە وشە ڕاستەکە لە تەنها یەک شوێندا، کلیک لە سەر (استبدال) دەکەین، دەبینین وشەکەمان بۆ دەگۆڕێت.. بەڵام ئەگەر وشە هەڵەکە لە چەند شوێنێک دووبارە بووبووە، بۆ ئەنجام دانی گۆڕینی وشە هەڵەکە لە هەموو شوێنەکان، کلیک لە سەر (استبدال الكل) دەکەین..



**رێگای دووەم:-**

دەتوانین کرداری گۆڕینی نووسینێک، یان وشەیەک لەناو نووسینێکی زۆردا، لەبەرنامەی وۆرد، لە رێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە (Ctrl + H)، هەمان شێوەی رێگای یەکەمان بۆ دەردەکەوێت، بە هەمان ئەو هەنگاوانەش کاری گۆڕینەکە تەواو دەکەین.



## ٣- چۆنییەتی چـــوونـــە ســـەر لاپـــەڕە

هـەروەها لـە نـاو نووسـینێکی زۆردا، بـۆ نموونـە ئەگـەر (٣٠٠) لاپـەڕە نووسـینمان هـەبوو، لـە جیـاتی ئـەوەی ئێمـە بـە شـێوەیەکی زەحمـەت بچینـە سـەر لاپـەڕەکان، ئـەوە دەتوانین بەشێوەیەکی ئاسـان ئەم کارە ئەنجام بدەین..

**ڕێگای یەکەم:-**

لـە نـاو ئـەو هـەموو لاپـەڕە زۆرە دەچینـە سـەر لیسـتی (تحـریر)، لەوێشـەوە دەچینە سەر (انتقال الی) و لەوێ یەک جار کلیکی لای چەپی لـە سـەر دەکـەین، شێوەیەکمان بـۆ دەردەچێت، لـەو شـێوەیەدا یـەک بۆشـایی هەیـە، لـەو بۆشـاییەدا ژمارەی ئەو لاپەڕەیە دەنووسین، کە دەمانەوێ بچینە سەری، ئنجا بۆ چوونـە سـەر لاپەڕەکە بە شێوەیەکی ئاسان، کلیک لە سەر (انتقال الی) دەکەین.



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین کرداری چوونە سەر لاپەڕەیەکی دیاریکراو لە ڕێگای کیبۆردەکەوە ئەنجام بدەین، ئەویش بە هۆی داگرتنی ئەم دوو کلیلە بەیەکەوە: (Ctrl +G)، هەمان شیوەی پێشوومان بۆ دەردەکەوێت، دەتوانین بەهەمان هەنگاوەکانی پێشوو ئەم کارە ئەنجام بدەین.



# ٤ چۆنییەتی ڕێکخستنی لاپـــەڕەکان

**بۆ ڕێکخستنی لاپەڕەکان لەسەر شاشە لە ناو بەرنامەی وۆرد، بە دوو ڕێگا دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین :**

**ڕێگای یەکەم:-**

بۆ ڕێکخستنی لاپەرەکان لەسەر شاشە لە ناو بەرنامەی وۆرد، سەرەتا دەچینە سەر لیستی (عرض )، لەوێ، بۆ ڕێکخستنی لاپەرەکان لەسەر شاشە، ئەم پێنج فەرمانـەمان هەیـە: ( ١- عـادي ٢- تخطيـط فـوري - ٣- تخطيـط الصفحـة ٤- مفصل ٥ المستند الرئيسي )، بـە هـۆی ئـەم پێنـج فەرمانـە، دەتوانـین لاپەرەکان هەر یەکی بە شێوەیەک لەسەر شاشە ڕێک بخەین.. بۆ ڕێکخسـتنی لاپەرەکان، لە ناو ئەم پێنج فەرمانەدا، بە شێوەیەکی بەردەوام لـە سـەر فـەرمانی (تخطيط الصفحة) دەبێت .



**ڕێگای دووەم:-**

هەروەها دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی هاتوچۆ، کە ئەمە شێوەکانیانە (  )، ئەنجام بدەین، یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر هەر یەک لەم شێوانە دەکەین، دەبینین شێوەی لاپەڕەکە لەسەر شاشە دەگۆڕێت.. وا باشترە شێوەی ڕێکخستنەکە لە سەر (تخطيط الصفحة) بێت، چونکە ئەم شێوەیە لە هەموو شێوەکانی تر ڕێکترە .



## ٥- چۆنییەتی دانان یان لابردنی شریتی بەشەکان

**بۆ دانان یان لابردنی شریتی بەشەکان لە ناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە کار بێنین :**

ئەو سێ شریتەی کە بە بەردەوامی لە ناو بەرنامەی وۆرد، لەسەر شاشەدا هەیە و، بۆ ئەنجام دانی هەندێک لە کار و فەرمانەکانی ناو بەرنامەکە بەکار دەهێنرێن، ئەگەر نەمابوون، ئەوا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (عرض)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (أشرطة الأدوات)، لیستێکمان بۆ دەردەکەوێت، بە هۆی یەک جار کلیکی لای چەپەوە ئەو شریتەی دەمانەوێت، بۆ نمونە شریتی (قياسي)، دیاری دەکەین.. دەبینین کە ئەو شریتە دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی تایبەتی خۆی لە ژێر شریتی لیستەکان.



هـەروەها بـۆ دانانـەوەی دوو شـریتەکەی دیکـەش، ( تنسـیق ) و (رسـم)، هەمان ئەو هەنگاوانەی پێشوو ئەنجام دەدەین.

هەروەها بۆ لابردنی ئەو شـریتانە، بـە هـەمان شـێوە دەچینـە سـەر شـریتی لیسـتەکان، لـەوێوە دەچینـە سـەر فـەرمانی (أشـرطة الأدوات )، لـەوێ، بـە پێچەوانەی ڕێگای پێشوو، هەڵدەستین بە لابردنی نیشانەی ڕاست (✔) لەسەر ناوی شریتەکان، بە هۆی یەک جار کلیکی لای چەپی ماوسەکەوە.

**تێبینی : لە ناو بەرنامەی وۆرد، سـێ شریتی گرنـگ هەیـە، کـە ئەمانەن: ١- قیاسی ٢- تنسیق ٣- رسم .**



## ٦- چۆنییەتی دانــان یان لا بــردنی ڕاستە

**بـەکارهێنانی ڕاسـتە لـە نـاو بەرنامـەی وۆرد، بـە کـارێکی گرنـگ دەژمێردرێت.. بۆ دانان یـان لابردنـی شریتی راسـتە، دەتوانـین ئـەم هەنگاوانە بە کار بێنین :**

پێویستە شریتی راستە بە بەردەوامی لـە نـاو بەرنامـەی وۆرد هـەبێ، کـە بـۆ ئەنجام دانی هەندێک لە کار و فەرمانەکانی ناو بەرنامەکە بەکاری دێنین، وەکـو پێوانەکردنی هەر بەشێک کە بمانەوێت لە ناو بەرنامەکە بە کاری دێنین..

بۆ دانان یان لابردنی شریتی راستە لە ناو ئەم بەرنامەیە، سەرەتا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (عرض)، لەوێشەوە دەچینـە سـەر فـەرمانی (المسـطرة)، لـەوێ یـەک جـار کلیکـی لای چـەپ لەسـەر فـەرمانی (المسطرة) دەکـەین، دەبینـین کـە لـە سـەر روبـەری لاپـەرەی بەرنامەکـە، شـریتی راستەمان بۆ دەردەکەوێ.



ئەگەر ویستمان ئەو شریتە لە ناو لاپەرەی بەرنامەکە لا بدەین، ئەوا بەهەمان ڕێگای پێشوودەچینە سەر شریتی لیستەکان و، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (عرض)، لەوێوە دەچینە سەر فەرمانی (المسطرة) و ئەو دیاری کردنەی کە لە سەری هەیە لادەدەین، دەبینین کە ڕووبەری لاپەرەی بەرنامەکە دەگەڕێتەوە بۆ دۆخی جارانی خۆی و شریتی ڕاستەی تێدا نامێنێت.. بەڵام لە هەموو کات وای بە باش دەزانین کە ئەو شریتە لە سەر ڕووبەری لاپەرەی بەرنامەکە بوونی هەبێت.



# بەشی چوارەم ( ٤ )

١- چۆنییەتی دانانی ژمارە بۆ لاپەڕەکان.

٢- چۆنییەتی دانانی کات یان بەروار بۆ لاپەڕکان.

٣- چۆنییەتی هێنانی شێوەیەکی تایبەتی.

٤- چۆنییەتی دانانی سەرچاوەی نووسین بۆ لاپەڕەکان.

٥- چۆنییەتی هێنانی وێنە بۆ ناو لاپەڕەکان.

٦- چۆنییەتی هێنانی شێوەیەك کە بە ماوس ڕێك دەخرێت.

## ١- چۆنییەتی دانـــانی ژمـــارە بـــۆ لاپەڕەکان

**بۆ دانانی ژمارە بۆ لاپەڕەکان لەناو بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم کارە بەم شێوەیەی خوارەوە ئەنجام بدەین، دەکرێ لە پێش ئەوەی نووسین بنوسین، یان لە دوای تەواو بوون لە نووسینەکە، ژمارەی لاپەڕە لە ناو لاپەڕەی بەرنامەکە دابنێین .**

سەرەتا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، ئنجا لە لیستی (أدراج)ـەوە دەچینە سەر فەرمانی (أرقام الصفحات) و، یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێت، لەو شێوەیەدا دەتوانین شوێنی ژمارەکە لە سەر لاپەرەکە هەڵبژێرین...



هەر لە ناو شێوەکەدا کلیک لەسەر (تنسیق) دەکەین، شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێت، لەوێ دەتوانین ئەوە هەڵبژێرین کە ژمارەی لاپەرەکە لە ژمارە چەندەوە دەست پێ بکات..

دوای هەڵبژاردنی ژمارەکە یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی (موافق) دەکەین، شێوەکەی دووەم لادەچێت، ئنجا یەک جار کلیکی لای چەپ لەسەر (موافق) دەکەین، دەبینین ژمارە دیاریکراوەکە لەو شوێنەی کە هەڵت بژاردوە لە ناو لاپەرەکە دادەنێت..

دوای دانانی ژمارەکە، ئەگەر لە لاپەرە (١) چووینە سەر لاپەرە (٢)، ئەوە پیویست ناکات دیسان هەمان کار ئەنجام بدەیتەوە، بەڵکو ئەو کارەی پێشوو بە شێوەیەکی راستەوخۆ ژمارەی لاپەرەکانی دیکەشمان بۆ دادەنێت، واتا خۆی ژمارەی لاپەرە (٢) و لاپەرە (٣) و لاپەرە (٤) و... تا ئەو شوێنەی کە تۆ نووسینی لێ دەکەیت، دادەنێ.



## ٢- چۆنییەتی دانانی کات یان بەروار بۆ لاپەڕەکان

**بۆ دانانی کات یان بەروار لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، کە زۆر جار پێویستمان بەوە دەبێت، دەتوانین ئەم کارە بەم شێوەیە ئەنجام بدەین :**

سەرەتا لە ناو لاپەرەکە دەست بە نووسین دەکەین، بۆ نموونە: نامەیەک دەنووسین؛ بۆیە نووسینی نامە بە نموونە دێنمەوە، چونکە هەموو کاتێک کە نامە دەنووسین، کات و بەرواری نامەکە لە ژێرەوەی لاپەرەکە دەنووسین. دوای نووسینی نامەکە و لە ژێرەوەی نامەکە، لەو شوێنەی کە خۆمان مەبەستمانە رادەوەستین، ئنجا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، لەوێوەش دەچینە سەر فەرمانی (التاريخ و الوقت )....



دوای چوونـه سـەر بەشی (التاريخ و الوقت)، کە ئـەو بەشـە تەنـها تايبەتـە بـە دانانی کات و بەروار بۆ لاپەرەکە، یەک جار کلیکی لای چەپی لە سـەر دەکـەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا چەند هەڵبژاردەیەکی تێدایە، کە تایبەتن بە کات و بەرواری (ئینگلیزی، عەرەبی)، (هیجری، میلادی).. جا هەر کام لەم هەڵبژاردانەمان بوێت، هەڵی دەبژێرین. بۆ هێنـانی کـات و بەروارەکـە بـۆ ناو لاپەرەکە، یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی (موافق) دەکەین.



## ٣- چۆنییەتی هێنانی شێـوەیەکی تایبەتی

**بۆ هێنانی شێوەیەکی تایبەتی بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد و کـارپێکردنی، دەتوانـین جگـە لـەو شـێوە تایبەتیانـەی کـە لـە سـەر کیبۆردەکە هەیە، هەندێ شێوەی تر، کە لە نـاو لیستەکاندا هەیـە بـە کاریان بێنین .**

ئەگەر ویستمان شێوەیەکی تایبـەتی بـۆ نـاو لاپەرەیـەکی بەرنامەکە بێنین، بـۆ نموونە شێوەی (تەلەفۆنێک: ☎)، یان شێوەی (مەقەسێک: ✂)، یان شێوەی (چاویلکەیەک: )، یان شێوەی (خانویەک: )، یان چەند شـێوەیەکی تـر، کە بە کیبۆردەکە دروست نابێت .... لـەو شـوێنەی کـە مەبەسـتمانە دەچینـە سـەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، لە ناو لیـستی (ادراج) دەچینە سەر فەرمانی (رمز...)



ئنجا یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر سەر فەرمانی (رمز...) دەکەین، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی شێوەکەدا، دەتوانین هەر یەک لەو بابەتانە هەڵبژێرین، کە هەر یەک لەو بابەتانە کۆمەڵێ شێوەی تایبەتیی تێدایە، دوای هەڵبژاردنی شێوە تایبەتیەکە، بۆ هێنانی شێوە تایبەتیەکە بۆ ناو لاپەرەی بەرنامەکە، دەچینە سەر فەرمانی (أدراج) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین.. ئنجا بۆ داخستنی شێوەکە یەک جار کلیکی لای چەپ لەسەر (اغلاق) دەکەین..



## ٤- چۆنییەتی دانانی سەرچاوەی نووسین بۆ لاپەڕەکان

**دانانی سەرچاوەی نووسینی وەرگیراو لەناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، بە یەکێك لە کارە سەرەکیەکانی بەرنامەی وۆرد دەژمێردرێت، هەرچەندە ئەم بەشە تایبەتە بە نووسەری کتێب و بڵاوکراوە، کاتێك نووسەر نووسینێك دەنووسێ، کە ئەو نووسینەی لە سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە، لە ژێرەوەی لاپەڕەکە ئەو سەرچاوەیە دیاری دەکات و ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە ئەو نووسینە هی کام نووسەرە..**

بۆ ئەنجام دانی ئەو کارە و دانانی سەرچاوە بۆ نووسینەکان، سەرەتا ئاراستەی ماوسەکە لەو شوێنە دادەنێین کە دەمانەوێ ژمارەی سەرچاوەکەی لێ دابنێین، ئنجا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (حواشي سفلية)....



ئنجا یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر (حواشي سفلية) دەکەین، دەبینین کە شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێ، لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی ژمارەکان، ئەو ژمارەیە دەنووسین کە دەمانەوێت، ئنجا بۆ دانانی ژمارەکە لە پشت نووسینەکە، یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەین، دەبینین کە لە خوارەوەی لاپەرەکە هەمان ژمارەمان بۆ دروست دەبێت، لەوێ دەست دەکەین بە نووسینی ناوی سەرچاوەکە، یان نووسەرەکە، یان چاپخانەکە .



## ٥- چۆنییەتی هێنانی وێنە بۆ ناو لاپەڕەکان

**بۆ هێنانی وێنەیەك بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، دوو شێوەمان هەیە: (١) وێنەی ناو بەرنامەکە، کە بە Clip Art ناسراوە (٢) لەڕێی فەرمانی (من الملف)، وا لە خوارەوە باسیان دەکەین :**

**ڕێگای یەکەم:**

ئەگەر ویستمان وێنەیەک لە ناو Clip Art بێنین، ئەوا سەرەتا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، ئنجا دەچینە سەر فەرمانی (صورة)، لەوێشەوە دەچینە سەر (...Clip Art) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت کە هەندێک وێنەی دەست کردی تێدایە، یەکێک لەو وێنانە هەڵدەبژێرین، بۆ هێنانی وێنەکە بۆ ناو لاپەرەکە، بەماوسەکە دەچینە سەر وێنەکە و یەک جار کلیکی لای راست دەکەین، لیستێکمان بۆ دەردەکەوێت، لەو لیستەدا یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی Insert دەکەین...



**ڕێگای دووەم:**

هەروەها دەتوانین ئەم وێنانە لە ڕێگایەکی ترەوە بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی (وۆرد ٢٠٠٠) بێنین، ئەو ڕێگایەش بەم شێوەیەیە:

لە ناو لاپەڕەکەدا دەچێنە بەشی خوارەوەی لاپەڕەکە و دەچینە سەر شریتی ناسراو بە شریتی (رسم)، لە سەر ئەو شریتەش دەچینە سەر شێوەی (کلیپ ئارت) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین چوارگۆشەی وێنەکانمان بۆ دەردەکەوێ، لەوێدا دەتوانین بە ئارەزووی خۆمان وێنەکان هەڵبژێرین و بە هەمان هەنگاوەکانی ڕێگای یەکەم لەناو لاپەڕەکە دایبنێین.



## بۆ هێنانی وێنە لە ناو ( ملف )

شێوەی دووەم لە (من الملف)ـەوە دەبێت، هەمان هەنگاوەکانی پێشوو ئەنجام دەدەین تا دەگەینە سەر فەرمانی (صورة)، ئنجا لەو لیستەی کە لە (صورة) دەردەچێت (من الملف) هەڵدەبژێرین و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەکەوێ، لەو شێوەیەدا دەتوانین وێنەکان ئەگەر لە ناو (cd) بوو ئەوە (cd)یەکە هەڵدەبژێرین، یان ئەگەر لە ناو دێسک بوو ئەوە دێسکەکە هەڵدەبژێرین، یان ئەگەر لە ناو بەشە هاردەکان بوو ئەوە بەشە هاردەکان هەڵدەبژێرین، دوای ئەوە وێنەکە هەڵدەبژێرین. بۆ هێنانی وێنەکە بۆ ناو لاپەرەی بەرنامەکە یەک جار کلیکی لای چەپ لەسەر لە سەر (أدراج) دەکەین.



## ٦- چۆنییەتی هێنانی شێوەیەك كە بە ماوس ڕێك دەخرێت

مەبەست لە ڕێكخستن بە ماوس ئەوەیە، كە ئەو شێوەیەی ئێستا باسی لێ دەكەین، دەتوانین تەنها بە ئاڕاستەی ماوسەكە لە ناو لاپەڕەكە ڕێكی بخەین، بۆ ئەنجام دان و هێنانی ئەو جۆرە شێوانەش دەتوانین ئەم هەنگاوانە بە كار بێنین .

**ڕێگای یەكەم:**

دەتوانین ئەم كارە لە ڕێگای شریتی ناسراو بە شریتی (رسم) ئەنجام بدەین، لە سەر ئەو شریتە دەچینە سەر بەشی (اشكال تلقائية) و لەوێ یەك جار كلیكی لای چەپ دەكەین، دەبینین شێوەیەكمان بۆ دەردەكەوێ، لەو شێوەیەدا كۆمەڵێ شێوەی تێدایە، دەتوانین ئەو شێوانە بە ئاراستەی ماوسەكە لە ناو لاپەرەكانی بەرنامەی وۆرد دروست بكەین.



**ڕێگای دووەم:**

هەروەها دەتوانین لەڕێگای شریتی لیستەکان ئەم کارە ئەنجام بدەین؛ دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (صورة)، کە چەند بەشێکی تری لێ دەبێتەوە، لەو بەشانەی تردا دەچینە سەر فەرمانی (أشكال تلقائية) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت کە چەند نموونەیەکی تێدایە، هەر یەک لەو نمونانە چەند بەشێکن، ئێمە بە پێی پێویست کام لەو نمونانەمان بوێت ئەوە هەڵدەبژێرین، دوای هەڵبژاردنی نمونەکە و شێوەی وێنەکە، یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کە ئاراستەی ماوسەکە دەبێت بە شێوەی (+)، ئنجا دەچینە سەر لاپەرەکە، لەوێ هەڵدەستین بە داگرتنی کلیکی لای چەپی ماوسەکە و ڕاکێشانی ماوسەکە بەو شێوەیەی کە مەبەستمانە، دوای تەواو بوونی شێوەکە، کلیکی لای چەپی ماوسەکە بەردەدەین، دەبینین کە لە سەر لاپەرەکە ئەو وێنەیەمان بۆ دروست دەبێت و بەو شێوەیەی کە خۆمان هەڵمان بژاردبوو .



# بەشی پێنجەم ( ٥ )

١- چۆنییەتی هێنانی شێوە نووسینێکی ئامادە کراو .

٢- چۆنییەتی هێنانی چوار گۆشەیەکی نووسین .

٣- چۆنییەتی گۆڕینی شێوەی نووسینەکان .

٤- چۆنییەتی دانانی ژمارە یان نیشانە بۆ سەرە دێڕەکان .

٥- چۆنییەتی دانانی چوارچێوە بۆ نووسین یان لا پەڕە .

## ١ - چۆنییەتی هێنانی شێوە نووسینێکی ئامادەکراو

**بۆ هێنانی شێوە نووسینێکی ئامادەکراو بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی ووۆرد ٢٠٠٠، دەتوانین ئەم چەند هەنگاوە بەکار بێنین.**

**ڕێگای یەکەم:**

دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی ناسراو بە شریتی (رسم)ـەوە ئەنجام بدەین.. لە سەر ئەم شریتە سەرەتا دەچینە سەر بەشی (ووۆرد ئارت) کە ئەمە شێوەکەیەتی: ( )، یەک جار کلیکی لای چەپی دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا نموونەی چەند شێوە نووسینێک هەیە، ئێمە دەتوانین یەکێک لەو نمونانە هەڵبژێرین، ئنجا کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەین، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت کە نووسینێکی تێدایە، ئەو نووسینە دەسڕینەوە، ئنجا ئەو نووسینەی کە خۆمان دەمانەوێ لە شوێنی نووسینە کۆنەکە دەینووسین و کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەینەوە، دەبینین ئەو نووسینەی نووسیمان بەو شێوەنووسینە ئامادەکراوەی لە پێشدا هەڵمانبژارد، بۆمان دێتە ناو لاپەڕەکە.



**ڕێگای دووەم:**

هەروەها ئەگەر ویستمان شێوەی نووسینێکی ئامادە کراو بۆ ناو لاپەڕەکە بێنین، کە ئەو شێوەیە لە ناو بەرنامەکە ئامادە کراوە، ئێمە تەنها دەستکاری نووسینەکە دەکەین و بەو شێوەیەی کە خۆمان مەبەستمانە دەیگۆڕین..
بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە و هێنانی ئەو بەشە، دەبێت سەرەتا بچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێ بچینە سەر لیستی (أدراج)، لەوێشەوە بچینە سەر فەرمانی (صورة)، کە ئەو فەرمانەش بەشی تری لی دەبێتەوە، لە بەشەکانی ئەو فەرمانە دەچینە سەر (Wordart) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین کە شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا نموونەی چەند شێوە نووسینێک هەیە، ئێمە دەتوانین یەکێک لەو نمونانە هەڵبژێرین، ئنجا کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەین، شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت کە نووسینێکی تێدایە، ئەو نووسینە دەسڕینەوە، ئنجا ئەو نووسینەی کە خۆمان دەمانەوێ لە شوێنی نووسینە کۆنەکە دەینووسین و کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەینەوە، دەبینین ئەو نووسینەی نووسیمان بەو شێوەنووسینە ئامادەکراوەی لە پێشدا هەڵمانبژارد، بۆمان دێتە ناو لاپەڕەکە..



## ٢- چۆنییەتی هێنانی چوار گۆشەیەکی نووسین

**بۆ هێنانی چوارگۆشەی نووسین بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد ٢٠٠٠، دەتوانین ئەم چەند هەنگاوە بە کاربێنین.**

**ڕێگای یەکەم:**

دەتوانین ئەم کارەش هەر لە ڕێگای شریتی ناسراو بە شریتی (رسم)ـەوە ئەنجام بدەین، بۆ ئەم کارەش پێویستە لەسەر شریتی (رسم) بچینە سەر هێمای چوارگۆشەی نووسین کە ئەمە شێوەکەیەتی ( )، ئنجا یەک جار کلیکی لای چەپی دەکەین، دەبینین کە ئاراستەی ماوسەکە دەبێت بە شێوەی (+)، ئنجا ئاراستەکە دەبەینە سەر لاپەرەکە، لەوێ کلیکی لای چەپ دەکەین بە بێ ئەوەی کلیکەکە بەر بدەین، رایدەکێشین تا ئەو ئاستەی خۆمان دەمانەوێت.. پاشان کلیکەکە بەر دەدەین، دەبینین شێوەی چوارگۆشەکەمان بۆ دروست دەبێت، ئنجا لە ناو چوارگۆشەکە دەست بە نووسین دەکەین.



# چۆنییەتی هێنانی چوار گۆشەیەکی نووسین

**ڕێگای دووەم:**

هەروەها دەتوانین ئەو کارە لەڕێگای شریتی لیستەکانەوە ئەنجام بدەین؛ کە دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (أدراج)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (مربع نص) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کە شێوەی ئاراستەی ماوسەکە دەبێت بە شێوەی (+)، ئنجا کلیکی لای چەپی ماوسەکە دەکەین و بە بێ ئەوەی کە کلیکەکە بەر بدەین، لەسەر لاپەرەکە رایدەکێشین، پاشان کلیکەکە بەر دەدەین، دەبینین کە چوارگۆشەی نووسینەکەمان بۆ دروست دەبێت، ئنجا نووسینەکە لەناو چوارگۆشەکە دەنووسین .



## ٣- چۆنییەتی گۆڕینی شـێـوەی نـووسـینـەکان

**بۆ گۆڕینی شێوەی خەتی ئەو نووسینانەی کە دەیان نووسین لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم کارە بەم شێوەیەی لای خوارەوە و بە پێی ئەم هەنگاوانە ئەنجام بدەین :**

**رێگای یەکەم:**

ئەگەر لە ناو لاپەرەکانی بەرنامەی وۆرد نووسینێکمان نووسی و، ویستمان شێوەی نووسینەکە لەو شێوەیەی کە لە سەریەتی، بیگۆڕین بۆ شێوەیەکی تر، سەرەتا ئەو بەشە نووسینە دیاری دەکەین، دوای دیاری کردنەکە دەچینە سەر ئەو بۆشاییەی کە لە سەر شریتی (تنسیق)دا هەیە، یەک جار کلیک لەسەر سێگۆشەکەی لای راستی بۆشاییەکە دەکەین، لیستی شێوە نووسینەکانمان پیشان دەدات، یەک یەک بە ناو ئەو شێوە نووسینانەدا دەگەڕێین، تا ئەو شێوەیە دەبینین کە خۆمان مەبەستمانە، ئنجا یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین ئەو نووسینەی نووسیومانە بەو شێوەیەی لێدێ کە خۆمان مەبەستمانە.



**ڕێگای دووەم:**

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە ڕێگایەکی ترمان هەیە، کە ئەویشیان بە هەمان شێوە سەرەتا نووسینەکان دەنووسین، دوای ئەوەی کە تەواو بوین، نووسینەکە دیاری دەکەین، ئنجا یەک جار کلیکی لای ڕاست لە سەر نووسینە دیاری کراوەکە دەکەین، لیستێکمان بۆ دەردەچێت، لەو لیستەدا دەچینە سەر فەرمانی (خط)، لەویش یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا دەچینە سەر ئەو بۆشاییەی کە دەکەوێتە ژێر وشەی (الخط) و کلیک لەسەر سێگۆشەکەی لای ڕاستی دەکەین، لیستی شێوە نووسینەکانمان بۆ دەردەکەوێت، شێوە نووسینێک دیاری دەکەین، ئنجا کلیک لەسەر (موافق) دەکەین، دەبینین کە شێوەی نووسینە دیاریکراوەکە گۆڕاوە بۆ ئەو شێوەیەی دیاریمان کردووە.



## ٤- چۆنییەتی دانانی ژمارە یان نیشانە بۆ سەرە دێڕەکان

**ئەگەر ویستت لە پێشەوەی ئەو چەند دێڕەی کە نووسیوتە نیشانە یان ژمارە دابنێی، ئەوە دەتوانی ئەم کارە بەم شێوەیە ئەنجام بدەیت:**

**ڕێگای یەکەم:**

سەرەتا ئەو چەند دێڕە دیاری دەکەین کە دەمانەوێ نیشانە یان ژمارەی بۆ دابنێین، ئنجا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (تنسیق)، لە ناو لیستی (تنسیق) دەچینە سەر فەرمانی (تعداد نقطي و تعداد رقمي) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێ، ئەگەر ویستمان نیشانە بۆ سەرە دێڕەکان دابنێین، ئەوا کلیک لەسەر (تعداد نقطي) دەکەین، دەبینین نیشانەکانمان پیشان دەدات، یەکێک لەو چەند نیشانەیەی کە تێیدایە هەڵدەبژێرین، بۆ دانانی نیشانەکە کلیک لە سەر (موافق) دەکەین.. ئەگەر ویستمان ژمارە بۆ سەرە دێڕەکان دابنێین، ئەوا کلیک لەسەر (تعداد رقمي) دەکەین، دەبینین چەند شێوەیەکی ژمارەییمان پیشان دەدات، یەکێک لەو چەند شێوە ژمارەییە هەڵدەبژێرین، بۆ دانانی ژمارەکە کلیک لە سەر (موافق) دەکەین.



**ڕێگای دووەم:**

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە ڕێگایەکی ترمان هەیە، کە بەم شێوەیە دەتوانین بە ئەنجامی بگەیێنین؛ دوای دیاری کردنی چەند دێرێک، دەچینە سەر شریتی ناسراو بە شریتی (تنسيق)، لەوێوە دەچینە سەر ئەو بەشەی کە ژمارە بۆ سەرە دێرەکان دادەنێت، یان ئەو بەشەی کە نیشانە بۆ سەرە دێرەکان دادەنێت، کە لە وێنەی خوارەوەدا ئاماژەمان بۆی کردووە، یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کە نیشانە یان ژمارە لە پێش ئەو چەند دێرە دادەنێت کە دیاریمان کردووە.



## ٥ - چۆنییەتی دانانی چوارچێوە بۆ نووسین یان لاپەڕە

### أ/ دانانی چوار چیوە بۆ نووسین

ئەگەر ویستمان چوارچێوەیەک تەنها بۆ نووسینەکە دابنێین، ئەوا سەرەتا نووسینێک دەنووسین، ئنجا ئەو نووسینە دیاری دەکەین، دوای ئەوە دەچینە سەر شریتی لیستەکان، ئنجا دەچینە سەر لیستی (تنسیق)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (حدود و تظليل) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا و لە بەشی (حدود) دەتوانین چوارچێوەیەک تەنها بۆ نووسینەکە دابنێین، ئەویش دوای هەڵبژاردنی جۆری راستەهێڵەکان و چۆنیەتی چوارچێوەکە، وەک لە بۆشاییەکانی شێوەکەدا هەن .



## ب/ دانانی چوار چیوە بۆ لاپەڕە

بۆ دانانی چوارچێوە بۆ لاپەرەکە، دەتوانین هەمان کارەکانی پێشوو ئەنجام بدەین، تا دەگەینە سەر فەرمانی (حدود و تظليل)، دوای کلیک کردن لە سەر ئەم بەشە دەچینە سەر (حد الصفحة)، لەوێ یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەی پێشوومان بۆ دەگۆڕی و دەبێتە شێوەیەکی تر، ئنجا بە هەمان شێوە جۆری راستەهێڵ و چۆنیەتی چوارچێوەکە لە بۆشاییەکاندا هەڵدەبژێرین، ئنجا بۆ دانانی چوارچێوەکە کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەین..



# بەشی شەشەم ( ٦ )

١- چۆنییەتی ڕێکخستنی نووسینەکان بەشێوەی ستوونی.

٢- چۆنییەتی ناردنی نووسینێك بۆ ووردبینی ڕێنووسی.

٣- چۆنییەتی ناردنی نووسینێك بۆ فەرهەنگۆك.

٤- چۆنییەتی زانینی ژمارەی پیت و وشە و دێڕ و لاپەڕەکان.

٥- چۆنییەتی پاراستنی نووسینەکە لە سڕینەوە.

## ١- چۆنییەتی ڕێکخستنی نووسینەکان بەشێوەی ستوونی

**ئەگەر بمانەوێت نووسینێکی زۆر بەشێوەی ستوون(عمود) لەناو لاپەڕەکانی بەرنامەی ووّرد ڕێك بخەین، ئەوا ئەم هەنگاوانەی خوارەوە دەگرینە بەر:**

**ڕێگای یەکەم:**

سەرەتا نووسینێکی زۆر بنووسە، ئەو نووسینە زۆرە دیاری بکە، ئنجا بچۆرە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە بچۆرە سەر لیستی (تنسیق)، لە ناو لیستی (تنسیق) بچۆرە سەر فەرمانی (أعمدة) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر بکە، دەبینین شێوەیەکی ترمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا چەند نمونەیەکت لە پێش چاودا هەیە، دەتوانی هەر کام لەو نمونانە هەڵبژێری، دوای هەڵبژاردنی نمونەکە یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر فەرمانی (موافق) بکە، دەبینیت نووسینەکانت لە یەک ستوونەوە بۆ دەکات بەو چەند ستوونەی کە خۆت هەڵت بژاردووە.



## ڕێگای دووەم:

بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە ڕێگایەکی تریشمان هەیە، کە ئەویش ڕێگایەکی ئاسانە، دوای دیاری کردنی نووسینەکانت بچۆرە سەر شریتی قیاسی، کە ئەو شریتە دەکەوێتە ژێرەوەی شریتی لیستەکان، ئنجا لەوێ ئەم شێوەیەت ( لە پێشدا هەیە، یەک جار کلیکی لە سەر بکە، لیستێک دەردەکەوێت کە چەند بەشێکی ستوونی تێدایە، ئەگەر ویستت نووسینەکان بە چەند ستوون دابنێی، ئەوەندە ستوونە هەڵبژێرە و کلیکی لەسەر بکە، دەبینیت کە نووسینە دیاریکراوەکانت بەشێوەی ئەوەندە ستوونە ڕێکخراوە کە هەڵتبژاردووە..



## ٢- چۆنییەتی ناردنی نووسینێك بۆ وردبینی ڕێنووسی

**ئەگەر نووسینێکی عەرەبی یان ئینگلیزیمان نووسی، بینیمان لە ژێرەوەی ئەو نووسینەدا خەتێکی بچوکی سور هەیە، ئەوە بە مانای ئەوە دێت، کە ئەو نووسینە لە ڕوانگەی ڕێنووسیەوە هەڵەیە، بۆیە ئەگەر ویستمان ئەو هەڵەیە چاك بکەینەوە، ئەوا ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر.**

سەرەتا ئەو نووسینانە دیاری دەکەین، ئنجا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی(أدوات)، ئنجا دەچینە سەر فەرمانی (تدقیق أملائي وتدقیق نحوی)و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا بۆشاییەک هەیە کە نووسینەکانی تێدا دیارە، یەکەم وشەی هەڵەش بە ڕەنگی سوور نووسراوە، لە ژێرەوەی بۆشایی نووسینەکە بۆشاییەکی تر دەبینین، کە چەند نمونەیەکی ڕاستکراوەی وشە هەڵەکەی تێدایە، ئێمە دەتوانین لە بۆشایی وشە ڕاستەکاندا، ئەو وشەیەی مەبەستمانە هەڵبژێرین و دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین وشە هەڵەکەمان بۆ دەگۆڕێ بە وشە ڕاستەکە.. ئیتر بەو شێوەیە تا کۆتایی نووسینەکان لەگەڵیدا دەڕۆین.



**تێبینی:-**

لە ناو بەرنامەی وۆرد، تەنها ئەو نووسینانەی کە بە زمانەکانی (عربی) و (ئینگلیزی) دەنووسرێن، بۆ بەشی وردبینی ڕێنووسی دەنێردرێن، چونکە بەرنامەکە هەر ئەو دوو زمانەوانیەی تێدایە.. لە نووسینی کوردیدا، لە ژێرەوەی هەموو نووسینەکاندا خەتێکی سوور پەیدا دەبێ، بەڵام ئەوە مانای وا نیە کە ئەو نووسینانە هەڵەن، بەڵکو مانای ئەوەیە کە ئەو بەرنامەیە ڕێنووسی زمانی کوردیی تێدا نیە .

## ٣- چۆنییەتی ناردنی نووسینێك بۆ فەرهەنگۆك

**بۆ ناردنی بەشە نووسینێك بۆ فەرهەنگۆك ( قاموس ) لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، دەتوانین ئەم کارە بە شێوەیەکی ئاسان ئەنجام بدەین، بەڵام ئەوەی کە شایانی باسە ئەم بەشە تەنها یەك یەك وشەکانمان بۆ وەردەگێڕێ .**

بۆ ناردنی نووسینێک بۆ فەرهەنگۆک، سەرەتا نووسینێکی (عربی) یان (ئینگلیزی) دەنووسین، ئنجا ئەو بەشە نووسینە دیاری دەکەین؛ مەبەستیش لەو بەشە نووسینە ئەوەیە، کە دەبێت تەنها یەک وشە دیاری بکەین، ئنجا دوای دیاری کردنەکە دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی (أدوات)، ئنجا لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی ( اللغة ).....



دوای چوونە سەر  بەشی (اللغة)، کە ئەو فەرمانە چەند بەشێکی لێ دەبێتەوە، لەو چەند بەشە ئێمە دەچینە سەر  فەرمانی (القاموس) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، ئەو شێوەیە لە دوو بەش پێکهاتووە، لەو بەشەی یەکەم ناوی وشەکە دەنووسی، لە بەشی دووەمدا، ئەو بەشە خۆی هەڵدەستی بە پێدانی مانای وشەکەی کە تۆ نووسیوتە، دوای ئەوەی کە ماناکەی نووسی، دەتوانی ئەو وشەیەی خۆت بەو وشەیەی ئەو بگۆڕی، ئەویش بە هۆی فەرمانی (ترجمة)ەوە.. بەو شێوەیە دەتوانی وشە بە وشە نووسینەکانت لە عەرەبییەوە بگۆڕی بۆ ئینگلیزی و بە پێچەوانەشەوە لە ئینگلیزیەوە بۆ عەرەبی .



## ٤- چۆنییەتی زانینی ژمارەی پیت و وشە و دێڕ و لاپەڕەکان

**بۆ زانینی ژمارەی پیت و وشە و دێڕ و لاپەڕە لە ناو بەرنامەی وۆرد، کە لە زۆر کاتدا پێویستمان پێیان دەبێت، دەتوانین ئەم کارە بەم شێوەیە ئەنجام بدەین :**

لە ناو بەرنامەی وۆرد، ئەگەر ویستمان ئەنجامی ئەو کارەی کە کردومانە بیزانین، ئەو نووسینانەی کە نووسیومانە ژمارەی پیت و وشە و دێڕ و لاپەڕەکانی بزانین، بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا نووسینێکی زۆر دەنووسین، ئنجا ئەو نووسینانە دیاری بکەین، دوای دیاری کردنەکە دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی(أدوات)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (عدد الكلمات) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین کە چوارگۆشەیەکمان بۆ دەردەکەوێ، لەو چوارگۆشەیە هەندێک نووسینی تێدایە، کە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چەند پیت و وشە و دێڕ و لاپەڕەن بەو شێوەیە دەزانین کە ئەنجامی کارەکانمان چەند و چۆن بووە...



**تێبینی:-**

ئەم کارە دەوەستێتە سەر ئەوەی، کە چەند نووسین دیاری بکەی، ژمارەی ئەوەندە نووسینەت پێ دەڵێت، واتا ئەگەر هەموو نووسینەکان دیاری بکەی، ژمارەی هەموو نوسینەکانت پێ دەڵێت، ئەگەر بەشێکی کەم دیاری بکەی، هەر ژمارەی ئەو بەشە کەمەت بۆ دەردەخات، ئەگەریش هیچ دیاری نەکەیت، ئەوا ژمارەی هەموو نووسینەکانت بۆ دەردەخات ..

## ٥- چۆنییەتی پاراستنی نووسینەکە لە سڕینەوە

بۆ ئەنجام دانی پاراستنی نووسینەکە سەرەتا هەندێک نووسین دەنووسین، بۆ ئەوەی بتوانین کاری پاراستنەکەی لە سەر ئەنجام بدەین، دوای ئەوەی نووسینەکەمان نووسی، دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێشەوە دەچینە سەر لیستی (أدوات)، ئنجا لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (حماية المستند) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچیت، لەو شێوەیەدا بۆشاییەک هەیە، ئێمە دەتوانین بۆ پاراستنی نووسینەکان لە دەستکاری و سڕینەوە لەلایەن کەسانی ترەوە، لەو بۆشاییەدا ژمارەیەکی نهێنی یان ناوێکی نهێنی بنووسین، دوای نووسینی ژمارە نهێنییەکە یەک جار کلیکی لای چەپ لەسەر (موافق) دەکەین، دەبینین بۆشاییەکی ترمان بۆ دەردەچێت، هەمان ژمارە نهێنیەکە یان ناوە نهێنیەکە لە بۆشایی دووەمدا دەنووسینەوە، ئنجا کلیک لەسەر (موافق) دەکەینەوە.. ئیتر بەو شێوەیە دەبینین ئەگەر هەوڵ بدەین نووسینەکە بسڕینەوە یان دەستکاری بکەین، ناتوانین، بەڵکو داوای وشە نهێنیەکەمان لی دەکات .



## لابردنی پاراستن لە سەر نووسینەکە

**دوای ئـەوەی کـە نووسـینەکانمان لــە سـڕینەوە و دەسـتکاری پاراست، کاتێك دێت کە پێویستمان بەوە دەبێت ئەو نووسینانە دەستکاری بکەین، ئنجا بۆ ئەوەی بتوانین ئەو نووسینانە دەستکاری بکەین، دەبێت ئەو پاراستنەی لەسەر لابدەین، ئەو کارەش بەم شێوەیە دەبێت:**

سەرەتا دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (أدوات)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (الغاء حماية المستند) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین بۆشاییەکمان بۆ دەردەکەوێ، دەبێت لەو بۆشاییە ژمارە نهێنییەکە بنووسینەوە، تا بتوانین جارێکی تر دەستکاری بکەین .



# بەشی حەوتەم ( ٧ )

١- چۆنییەتی هێنانی خشتە بۆ ناو بەرنامەکە.

٢- چۆنییەتی ڕێکخستنی خشتەکە لە ناو بەرنامەکە.

٣- چۆنییەتی زیاد کردنی ڕیز یان ستون بۆ خشتەکە.

٤- چۆنییەتی سڕینەوەی ڕیز یان ستون لە خشتەکە.

٥- چۆنییەتی دیاری کردن و سڕینەوەی خشتەکە لە ناو لا پەڕە.

## ١- چۆنییەتی هێنانی خشتە بۆ ناو بەرنامەکە

**بۆ هێنانی خشتە(جدول)ێك بۆ ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد و کار کردن لە سەر ئەو خشتەیە، دەتوانین بەم دوو ڕێگایەی لای خوارەوە ئەو کارە ئەنجام بدەین :**

**ڕێگای یەکەم:**

دەتوانین ئەم کارە لە ڕێگای شریتی ناسراو بە شریتی ( قیاسي )یەوە بەم شێوەیە ئەنجام بدەین؛ سەرەتا دەچینە سەر شریتی (قیاسي)، لەوێوە دەچینە سەر ئەم شێوەیە ( ) و یەک جار کلیکی لای چەپی لە سەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا چەند بەشە خشتەمان بوێت، ئەوەندە بە ئاراستەی ماوسەکە هەڵدەبژێرین، ئنجا کلیکەکە بەر دەدەین، دەبینین کە خشتەکەمان بۆ دێتە ناو لاپەڕەکە .



**ڕێگای دووەم:**

هەروەها دەتوانین لە ناو لاپەرەکانی بەرنامەی وۆرد، لەرێگای شریتی لیستەکانەوە ئەم کارە ئەنجام بدەین، دەچینە سەر شریتی لیستەکان، لەوێوە دەچینە سەر لیستی (جدول)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (أدراج)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (جدول) و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین، دەبینین شێوەیەکمان بۆ دەردەچێت، لەو شێوەیەدا سێ بۆشایی دەبینین: لە بۆشایی یەکەمدا ژمارەی خشتە ستوونیەکان دیاری دەکەین، لە بۆشایی دووەمدا ژمارەی خشتە ئاسۆییەکان دیاری دەکەین، لە بۆشایی سێیەمدا پانی و بەرینی خشتە ستونیەکان و خشتە ئاسۆییەکان دیاری دەکەین، دوای دیاری کردنی ئەم بەشانە، یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر (موافق) دەکەین، دەبینین خشتەیەک بەو شێوانەی هەڵمان بژاردبوو لە ناو لاپەرەی بەرنامەکە دروست دەبێت.



## ٢- چۆنییەتی ڕێکخستنی خشتەکە لە ناو بەرنامەکە

ئەگەر ویستمان ئەو خشتەیەی، کە لە ناولاپەڕەکانی بەرنامەکەدا هەن، ڕێکیان بخەین، ئەوا سەرەتا بە ئاراستەی ماوسەکە دەچینە سەر ئەو بەشە خشتەیەی دەمانەوێ ڕێکی بخەین، لەوێدا ئاراستەکە لە سەر ئەو بەشە ڕادەگرێن تا دەبینین کە شێوەی ئاراستەکە دەبێت بە هێمای (⇳)، دوای ئەوەی کە ئاراستەی هێماکە بوو بەو شێوەیە، یەک جار کلیکی لای چەپ لە سەر لایەکی خشتەکە دەکەین و کلیکەکە بەر نادەین، ئنجا ئاراستەی ماوسەکە بەو ئاراستەیەی کە خۆمان مەبەستمانە ڕادەکێشین، کە گەیشتینە ئەو شوێنەی دەمانەوێ، ئاراستەی ماوسەکە بەردەدەین، دەبینین شێوەی خشتەکە لە سەر شێوەکەی جارانی نەماوە و بەو شێوەیەی کە خۆت ئەنجامت داوە گۆڕاوە.



**تێبینی :-**

دەتوانی ڕێکخستنی خشتە لە ناو لاپەڕەی بەرنامەی (ووٚرد ٢٠٠٠) بە هەردوو لای خشتەکە بەکار بێنی، واتا ئەگەر ویستمان خشتەکە بە پانی ڕێک بخەین، ئەوا ئاراستەی ماوسەکە بەو شێوەیە دەبەینە سەر لایەکی ستوونی خشتەکە و بە ئاراستەی ماوسەکە رایدەکێشین، ئەگەریش ویستمان خانەکان لە لای راستەوە بۆ چەپ یان لە چەپەوە بۆ راست ڕێک بخەین، ئەوا ئاراستەی ماوسەکە لە تەنیشت خەتەکانی خانەکە دادەنێین، تا دەبێت بە شێوەی (⇳)، ئنجا رایدەکێشین تا ئەو شێوەیە وەردەگرێ کە خۆمان مەبەستمانە .



## ٣- چۆنییەتی زیاد کردنی ڕیز یان ستون بۆ خشتەکە

**بۆ زیاد کردنی ڕیزێك، یان ستوونێك بۆ خشتەکە، دەتوانین ئەم کارەش وەکو کارەکانی ڕابردوو بە ئاسانی، بە پێی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە، ئەنجام بدەین.**

### ڕێگای یەکەم:

بۆ ئەنجام دانی زیاد کردنی ریز یان دێڕ، سەرەتا بە ئاراستەی ماوسەکە دەچینە ئەو شوێنە لە خشتەکە کە دەمانەوێ زیادەکەی لی دابنێین، ئنجا دەچینە سەر لیستی (جدول)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (أدراج)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (أعمدة) یان (صفوف)، بۆ ئەنجام دانی کارەکە بەپێی پێویستی خۆمان کلیک لەسەر یەکێکیان دەکەین.



**ڕێگای دووەم:**

ئەگەر ویستمان لە ناو لاپەرەکانی بەرنامەی وۆرد، ریزێک یان ستوونێک بۆ ناو خشتەکە زیاد بکەین، ئەوا دەبێت بە ئاراستەی ماوسەکە بچینە سەر ئەو بەشە خشتەیەی کە دەمانەوێ بەشێکی تری بۆ زیاد بکەین، لەوێ یەک جار کلیکی لای راست لە سەر ئەو بەشە دەکەین، دەبینین ئەو بەشە رەش دەبێت و لیستێکمان بۆ دەردەچێ، لەو لیستەدا، بۆ زیاد کردنی بەشە خشتەیەکی ستوونی، دەچینە سەر فەرمانی (أدراج عمود)، بۆ زیاد کردنی بەشە خشتەیەکی ئاسویی، لە هەمان لیست کلیک لە سەر (أدراج صفوف) دەکەین، بەو شێوەیە دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین .



# ٤- چۆنییەتی سڕینەوەی ڕیــز یان ستــون لە خشتەکە

**بۆ سڕینەوەی ڕیزێك، یان ستوونێك لە ناو خشتەکە، دەتوانین ئەم کارەش وەکو کارەکانی ڕابردوو بە ئاسانی، بە پێی ئەم هەنگاوانەی لای خوارەوە، ئەنجام بدەین :**

**ڕێگای یەکەم:**

بۆ سڕینەوەی ریز یان ستوون، سەرەتا بەشە خشتەکە دیاری دەکەین، کە بینیمان بەشە خشتەکە رەش بوو، ئنجا دەچینە سەر لیستی (جدول)، لەوێشەوە دەچینە سەر فەرمانی (حذف)، لەوێشەوە دەچینە سەر (أعمدة) یان (صفوف)، بۆ سڕینەوەی ستونێک یان ریزێک لە ناو لاپەرەکانی بەرنامەی وۆرد ٢٠٠٠، کلیک لەسەر یەکێکیان دەکەین.



**ڕێگای دووەم:**

ئەگەر ویستمان ڕیزێک یان ستوونێک لە ناو خشتەکە بسڕینەوە، ئەوا دەبێت بە ئاراستەی ماوسەکە بچینە سەر ئەو بەشە خشتەیەی کە دەمانەوێ بەشێکی لێ بسڕینەوە، ئنجا لەوێ یەک جار کلیکی لای ڕاست لە سەر ئەو بەشە دەکەین، دەبینین ئەو بەشە ڕەش دەبێت و لیستێکمان بۆ دەردەچێ، لەو لیستەدا، بۆ سڕینەوەی ستونێک دەچینە سەر فەرمانی (حذف أعمدة)، بۆ سڕینەوەی بەشە خشتەیەکی ئاسۆیی، لە هەمان لیست کلیک لە (حذف صفوف) دەکەین، بەو شێوەیە دەتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین .



## ٥ - چۆنییەتی دیاری کردن و سڕینەوەی خشتەکە لە ناو لاپەڕە

لە ناو لاپەڕەکانی بەرنامەی وۆرد، دوای ئەوەی کە ئیشمان بە خشتەکە نەما، بە ئاراستەی ماوسەکە دەچینە سەر بەشێک لە دەرەوەی خشتەکە و کلیکی لای چەپ دەکەین، بێ ئەوەی کلیکەکە بەر بدەین، ئنجا ئاراستەی ماوسەکە رادەکێشین بەو شێوەیەی کە لە دەرەوە خشتەکەمان بۆ دیاری دەکات، ئنجا کە تەواو زانیمان ئاراستەی ماوسەکە گەیشتە ئەو ئاستەی کە تەواو خشتەکە دیاری دەکات، ئاراستەکە بەر دەدەین، دەبینین کە خشتەکە بە گشتی دیاری دەبێ، بۆ سڕینەوەی خشتەکە لە ناو لاپەڕەکە، دەچینە سەر لیستی (تحریر) و فەرمانی (مسح) هەڵدەبژێرین، یان لە سەر کیبۆردەکە کلیلی (Delete) دادەگرین..



# پێرست